Ba_Kurty

٢٠ فائدة في الاستقامة بعد رمضان
و الإجازة الصيفية

# ٢٠ خاڵی گرنگ سەبارەت بە
# بەردەوام بوون لەسەر دین
# لە دوای مانگی ڕەمەزان



تۆڕی زانستی بەهەشت

www.ba8.org

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه ، أما بعد:

**خوشک و برای بەڕێز :** ئەمە کۆمەڵێك نەصیحەت و ئامۆژگاری یە سەبارەت بە **ئیستیقامە و بەردەوام بوون لەسەر دین و خواپەرستی لە دوای مانگی ڕەمەزان لەگەڵ پشووی هاوین** ، داوا دەکەین لە خوای گەورە بیکاتە مایەی سوود ، وە پاداشتی خێری ئەو کەسە بداتەوە کە بڵاوی دەکاتەوە و یارمەتیدەرە بۆ بڵاوکردنەوەی.

١- ئەو کەسەی کە خوای گەورە یارمەتیدا لە مانگی ڕەمەزان لەسەر عیبادەتکردن کاتەکانی بەسەر برد لە عیبادەت و نزیك بوونەوە لە خوای گەورە بە شەو و ڕۆژ، پێویستە لەسەری لە دوای مانگی ڕەمەزانیش بەردەوام بێت لەسەر عیبادەتەکانی و سارد نەبێتەوە .

٢- بەردەوام بوون لەسەر دین گەورەترین ڕێز و کەرامەتە، وە یەکێکە لە گەورەترین نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەکەیەوە.

بۆیە کاتێك سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای ثەقەفی (ڕەزای خوای لێبێت) داوا دەکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری شتێکی بکات گشتگیر و کۆکەرەوە بێت لە

ئیسلام، تاوەکو پێویستی بە کەسی تر نەبێت پرسیاری لێ بکات، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکم پێ بڵێ لە ئیسلامدا تا دوای تۆ داوا لە هیچ کەسێکی تر نەکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: " **قُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ، فَاسْتَقِمْ** "[1] "بڵێ: باوەڕم بەخوا هێناوە و بەردەوام ببە لەسەری".

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١١٢ ﴾(هود).

واتە: ئەی محمد ﷺ دامەزراو بە بەو شێوازەی کە فەرمانت پێ کراوە لەلایەن خوای گەورە وە ئەوانەیشی

---

[1] رواه مسلم (٣٨).

کە تەوبەیان کردووە لەگەڵ تۆداو بۆ لای خوای گەورە گەڕاونەتەوە با ئەوانیش دامەزراو بن، بەڵام سنوور مەبەزێنن لە خراپەکاریدا بەڕاستی خوای گەورە زۆر بینەرە بەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٣٠ ﴾ (فصلت).

واتە: ئەو کەسانەی کە ئەڵێن پەروەردگاری ئێمە تەنها (الله)یە، پاشان ئیستیقامەیان هەیەو جێگیرو چەسپاو و دامەزراون لەسەر یەکخواپەرستیو کردەوەی چاكو جێبەجێ کردنی فەرزەکان فریشتەکانی خوای

گەورە لە کاتی گیانکێشان و زیندوو بوونەوەو دەرچوون لەگۆڕو چوونە بەهەشت دائەبەزنە سەریانو پێیان ئەڵێن: ئێوە مەترسێن ترستان لەسەر نیە لەمەودوا ئەمین ئەبن وە خەفەتیش مەخۆن لەوەی کە لە دونیا بەجێتان هێشتووە لە سامانو منداڵ و خێزان ، وە موژدە بێ لێتان بەو بەهەشتەی کە ئێوە بەڵێنتان پێ درابوو.

ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەم ئایەتەی لەسەر مینبەر خوێندەوە و فەرمووی: بەردەوامبوون لەسەر عیبادەتی خوای گەورە، وە لانادەن و فێڵ ناکەن وەکو ڕێوی. [١]

---

[١] تفسير الطبري (٤٢٥/٢٠).

وە ئیمامی قەتادە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەی: بەردەوامبن لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە و سەرپێچی مەکەن.

وە حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کاتێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: ئەی الله تۆ پەروەردگارمانی، بەردەوامبوونمان پێ ببەخشە لەسەر دین.[1]

مەبەست لە ئایەتەکە: بەردەوامبوون لەسەر فەرمان و گوێڕایەڵی خوای گەورە، وە لەسەر ئەخلاق و خوڕەوشتی ئەو کەسانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن بەبێ

[1] تفسير الطبري (٢٠/٤٢٥).

لادان بەلای ڕاست و چەپ، کە ئەمەش هەموو گوێڕایەڵییەك دەگرێتەوە ئەوەی ئاشکرایە و ئەوەی نهێنییە، وە دووركەوتنەوە لە هەموو قەدەغەكراوەكان. [١]

٣- موسڵمان دەبێت بەردەوام بێت لەسەر دینەكەی، كردەوەی باوەڕدار لە كاتێك لە كاتەكان كۆتایی نایات تا ئەو ڕۆژەی دەمرێت، وەكو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ (الحجر).

واتە: وە عیبادەتی پەروەردگارت بكە تا ئەو كاتەی ئەمریتو مردنت پێ ئەگات.

---

[١] جامع العلوم والحكم لابن رجب (١/٥١٠).

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: خوای گەورە هیچ شتێکی بۆ باوەڕدار دانەناوە لە کردەوە داببڕێت جگە لە مردن. پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە.[١]

عەبدول ڕەحمانی کوڕی مەهدی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەگەر بە حەممادی کوڕی سەلەمە بوترایە: تۆ بەیانی دەمریت، ئەوا هیچ کردەوەیەکی زیاتر نەبوو ئەنجامی بدات.

---

[١] لطائف المعارف لابن رجب، لاپەڕە (٢٢٣).

وە ئیمامی ذەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: کاتەکانی بە عیبادەت و زیکرەوە بەسەر دەبرد.[١]

لە دوعاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الْأَمْرِ، وَالْعَزِيمَةَ عَلَى الرُّشْدِ"[٢]

واتە: خوایە من داوای جێگیربوونت لێ دەکەم لەسەر دینەکەت، وە جدییەتی و کاری چاك و سەرفرازی.

---

[١] سير أعلام النبلاء (٤٤٧/٧)، بە دەستکارییەوە.

[٢] رواه الترمذي (٣٤٠٧)، والنسائي (١٣٠٤)، وصححه الألباني لغيره.

ئیمامی ئیبنول قەیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: هیممەت بەرزی موسڵمان و نییەتێکی ڕاست، ئەگەر ئەو دووانە (یەعنی هیممەت بەرزی و نییەتێکی پاك و ڕاست) کۆبووەوە ئەوە بەندە دەگاتە جێی مەبەست.

٤- موسڵمان لە عیبادەتێکەوە بۆ عیبادەتێکی تر بڕوات و بەردەوام بێت، خێر و چاکەی زیاد بکات لە هەموو تەمەنی، عیبادەت لە کاتێك و وەرزێك ناوەستێت، بەڵکو عیبادەتەکان بەردەوام دەبن خوای ڕەمەزان خوای مانگەکانی تریشە، موسڵمان فەرمانپێکراوە هەموو کاتێك عیبادەتی خوای گەورە

بکات، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي
وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ
أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ [سورة الأنعام].

واتە: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: نوێژ کردنو حەیوان سەربڕینو ژیانو مردنم بۆ الله یە کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، چۆن نوێژ کردن بۆ غەیری خوا شەریك دانانە، حەیوان سەربڕینیش بۆ غەیری خواو ناوی غەیری خوای لەسەر بێنی ئەویش هەر شەریك دانانە بۆیە خوای گەورە بەیەکەوە هێناویەتیەوە, وە تەنها بۆ خوا ئەژیم وە لە پێناو خوای گەورەشدا ئەمرم، لەم شتانە خوای گەورە شەریکی نیە چۆن لە

نوێژدا شەریکی نیە هەر ئەبێ بۆ ئەو بیکەی لەسەربڕینیشدا شەریکی نیەو دەبێت ئاژەڵ هەر بۆ ئەو سەرببڕی، وە بەم شتانە من فەرمانم پێکراوە لەلایەن خوای گەورەوە، وە من یەکەم موسڵمانم لە ئوممەتەکەی خۆم.

خراپترین کەس ئەو کەسەیە کە خوای گەورە نەناسێت تەنها لە ڕەمەزان نەبێت.

لە هۆکارەکانی دواکەوتنی بەندە: ئەوەیە بەندە بگەڕێتەوە بۆ سەر خراپەکاری لە پاش عیبادەت، پەنا دەگرین بەخوا لە دواکەوتن و سەرشۆڕی.

٥- خوای گەورە نمونەمان بۆ دەهێنێتەوە لە قورئان لەپاش ئەو عەهد و پەیمانەی داومانە وە وازهێنان لە عیبادەت و گەڕانەوە بۆ پێشوو، وە خراپکردنی کردەوە چاکەکان بە کردەوەی خراپ، خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا ﴾ [سورة النحل ٩٢].

واتە: وە ئێوە وەك ئەو ئافرەتە مەبن کە ڕێسەکەی کردەوە بە خوری دوای ئەوەی کە خوریەکی زۆری ڕێسابوو دواتر هەمووی هەڵوەشاندەوە.

وتراوە: ئافرەتێك بووە عەقڵی لە دەستداوە و تووشی وەسوەسە بووە، تەشییەکی پێبووە خوری و

سوف و پەمووی تەشی دەکرد، فەرمانی دەکرد بە خزمەتکارەکانی تەشی بکەن ئەوانیش بەقسەیان دەکرد تا نیوەی ڕۆژەکە خەریك بوون، کاتێك خەریك بوو تەواو دەبێت پێیانی دەوت: هەمووی هەڵوەشێننەوە، هەموویان هەڵدەوەشانەوە و وەکو پێشوویان لێ دەکرد کە ئەوە عادەتی بوو.

ئەمە نمونەیەکە خوای گەورە بۆمانی دەهێنێتەوە کە ئەو ئافرەتە خورییەکەی هەڵدەوەشانەوە، ئێمەش ئاوها عیبادەتەکانمان هەڵنەوەشێنینەوە لەپاش عیبادەتکردنمان و خۆمان نەشوبهێنین بەو ئافرەتەوە، کە ئەوە لە ئیشی کەسی عاقڵ ناچێت و ئەوەیشی وابکات لۆمەکراوە. [1]

[1] تفسير الطبري (١٤/٣٤٢)، والبغوي (٥/٣٩)، وابن كثير (٤/٥٩٩).

٦- پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادارمانی کردووەتەوە لەوەی لەپاش عیبادەتکردن وازی لێبهێنین، بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری (ڕەزای خوایان لێبێت) فەرموو: «يَا عَبْدَ اللَّهِ، لاَ تَكُنْ مِثْلَ فُلاَنٍ كَانَ يَقُومُ اللَّيْلَ، فَتَرَكَ قِيَامَ اللَّيْلِ». [1]

واتە: «ئەی عەبدوڵڵا وەکو فڵان کەس مەبە، شەونوێژی دەکرد دوای وازی لێهێنا».

٧- لە گەورەترین هۆکارەکانی بەردەوام بوون لەسەر دین پشت بەستن و داواکردنە لە خوای گەورە: بەوەی داوا بکات لە خوای گەورە جێگیربوون و بەردەوامی پێببەخشێت لەسەر عیبادەت.

[1] رواه البخاري (١١٥٢)، ومسلم (١١٥٩).

٨- بەردەوام بوون لەسەر دین ئازایەتی و لێهاتووی خۆت نییە، بەڵکو یارمەتیدان و منەتی خوای گەورەیە بەسەرتەوە، وەکو پیاوچاکان دوعایان دەکرد و دەیان فەرموو: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾. [آل عمران].

واتە: ئەمە هەر قسەی زانا چەسپاو و دامەزراوەکانە لە عیلمدا ئەڵێن: ئەی پەروەردگار دڵمان لە حەق لانەدەی بەوەی کە شوێن ئایەتی موتەشابیە بکەوین لە دوای ئەوەی کە هیدایەتی ئێمەت دا بۆ حەق، وە لە لایەن خۆتەوە ڕەحمەمان پێ بکە بە دڵنیایی هەر تۆ بەخشەری هەموو شتێکی.

وە یەکێك لە دوعاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ:

"اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو، فَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ". [١]

واتە: خوایە تۆ بەڕەحمی تکام وایە، نەمدەیتە دەست نەفسی خۆم بۆ چاو تروکاندنێکیش.

وە زۆرترین دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: **"يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ"**. **(٢)**

واتە: ئەی خوایە دڵەکان دەگۆڕیت، دڵم جێگیر بکە لەسەر دینەکەی خۆت.

---

[١] رواه أبو داود (٥٠٩٠), وحسنه الألباني.

[٢] رواه الترمذي (٢١٤٠), وهو في صحيح الجامع (٧٩٨٧).

٩- لە وەسێت و ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لێبێت) دەیفەرموو: " **إِذَا كَنَزَ النَّاسُ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ، فَاكْنِزُوا هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الْأَمْرِ، وَالْعَزِيمَةَ عَلَى الرُّشْدِ".** [1]

واتە: ئەگەر خەڵكی زێڕ و زیویان كۆكردەوە و بەدوای دونیا كەوتن، ئەوا ئێوە ئەم چەند وشەیە كۆبكەنەوە و بیڵێن: خوایە من داوای جێگیربوونت لێ دەكەم لەسەر دینەكەت، وە جدییەتی و كاری چاك و سەرفرازی.

[1] السلسلة الصحيحة (٣٢٢٨).

١٠- لە هۆکارەکانی بەردەوام بوون لەسەر دین، تێکۆشانە بەرامبەر نەفس ئیرادە و ویستێکی ڕاستگۆیانەیە، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾. (العنكبوت: ٦٩).

واتە: وە ئەو کەسانەی کە لە پێناو ئێمەدا جیهادیان کردووە,ئەوە بەدڵنیایی هیدایەتیان ئەدەین بۆ ڕێگای ڕاستی خۆمان,وە بە دڵنیایی خوای گەورە لەگەڵ چاکەکاراندایە بەوەی کە پشتیوانیان ئەکاتو سەریان ئەخاتو یارمەتیان ئەداتو هاوکاریان ئەکات.

١١- لە هۆکارەکانی بەردەوام بوون لەسەر دین، هاوڕێیەتی و تێکەڵبوونە لەگەڵ کەسانی چاك و ئەوانەی دامەزراون.

١٢- حەقیقەتی ژیانی مرۆڤ کاتەکانییەتی کە ئەوە هەموو سەروەت و سامانەکەیەتی، وەکو حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم تۆ پێکهاتووی لە چەند ڕۆژێك، هەرکاتێك ڕۆژێکت لێ دەڕوات هەندێك لە تەمەنت دەڕوات.

١٣- کاتەکانی مرۆڤ هۆکارە بۆ خۆشبەختی ڕۆژی دوایی یان هۆکاری سزایە.

١٤- ئیمامی ئیبنول قەیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەگەر خوای گەورە ویستی خێری هەبێت بۆ بەندەکەی یارمەتی دەدات کاتەکانی لە باشەدا بەسەربەرێت.

١٥- یەکێك لە نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەوەیە کاتەکان لە خێردا بەسەرببرێت. وەکو لە فەرموودەدا هاتووە: "نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ" [١] واتە: دوو نیعمەت زۆرێك لە خەڵکی لێی بێ ئاگان و دۆڕاون تێیدا و نەیان توانیوە لەخێردا بەکاری بێنن، ئەویش لەشساغی و کاتی دەست بەتاڵییە.

[١] رواه البخاري (٦٤١٢).

١٦- شەرع هانمانی داوە بۆئەوەی کاتەکان لە خێردا بەسەربەرین، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: " اغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هِرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ "[١]

واتە: پێنج شت بەدەست بخە پێش ئەوەی پێنج شتی ترت بەسەربێت: گەنجیت پێش پیربوون، لەشساغی پێش نەخۆشی، دەوڵەمەندی پێش فەقیری، دەستبەتاڵی پێش سەرقاڵی، وە ژیانت پێش ئەوەی بمریت.

---

[١] صحيح الجامع (١٠٧٧).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمانی ڕوون کردووەتەوە کە پرسیار دەکرێت لە بەندەکان لە ڕۆژی دوایی چی کردووە، فەرموویەتی: "لَا تَزُولُ قَدَمُ ابْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عِنْدِ رَبِّهِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ خَمْسٍ، عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أَفْنَاهُ، وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ، وَمَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَمَاذَا عَمِلَ فِيمَا عَلِمَ". [١] واتە: پێی هیچ کەسێك ناجوڵێت لای خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی تا پرسیاری لێ نەکرێت لەسەر پێنج شت، لەسەر تەمەنی لەچیدا بەسەری برد، گەنجێتی لەچیدا بەسەر برد، ئەو ماڵەی هەیبوو چۆن پەیدای کرد و لەچیدا خەرجی کرد، ئەو عیلمەی هەیبوو چی پێکرد.

---

[١] رواه الترمذي (٢٤١٦)، وصححه الألباني.

١٧- لە تەواوی دین و گەورەییەکەی ئەوەیە ئەو تەشریع و یاسایانەی دایناوە هەموو شتێك دەگرێتەوە، گونجاوە بۆ هەموو کات و شوێنێك.

١٨- لە ئاسانکاری ئیسلام و لێبووردەییەکەی حەڵاڵەکانی لەسەر خەڵك زۆرتر کردووە وەکو لە حەرام، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴾. [الروم: ٣٠]

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ ڕووی خۆت بە پاکی ڕابگرەو دامەزراو بە لەسەر دین‌و تەوحیدی خوای گەورە، ئەم دینە پاکە ئەو فیترەتە پاکەیە کە خوای گەورە خەڵکی خستۆتە سەری، واتە: خەڵکی کە لە دایك دەبن

لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلامن، دواتر دایكو باوكو دەوروبەر دەیانگۆڕنو کاریگەریان لێدەکەن.

ناوی حەڵاڵەکانی نەهێناوە، چونکە زۆرن لە ژماردن نایات.

١٩- ڕێگەدراوە بە موسڵمان کە کات بەسەربەرێت بە حەڵاڵی، خۆشی بخاتە دڵ خۆی ماڵ و منالی، وە شتە حەڵاڵەکان لەززەتی لێ وەربگرێت بەڕێگەی حەڵاڵ.

بۆ ئەوەی ئەو بێتاقەتی و هیلاکییەی هەیەتی لەسەری نەمێنێت، بە گەڕان و سەیران و گەشت و گوزار کردن.

٢٠- گەشتە هاوینەییەکان دەرفەتێکی گەورەیە بۆ بەدەستهێنانی کۆمەڵێك بابەتی بەسوود، لەوانە:

- لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز.

- ڕۆیشتن بەرەو فێربوونی زانستی شەرعی.

- بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی و حوکمە شەرعییەکان.

- هاندان بۆ کاری خێر و چاکە.

- چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، وە سەردانی کردنی خزم و کەس و کار.

- وەرزش بۆ بەهێزکردنی ئەندامەکانی لاشە.

- فێربوونی زانستە سەردەمییەکان، وەکو (درووین و دارتاشی و ... هتد).

- هاوڕێیەتی کەسانی چاك.

داوا دەکەین لە خوای گەورە یارمەتیمان بدات لەسەر زیکر و شوکرانەبژێری و عیبادەتی خۆی، وە فێری ئەوەمان بکات کە سوودمان پێ دەگەیەنێت، وە بەرەکەت بکاتە کات و کردەوەکانمان.

والحمد لله رب العالمين

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

**برا و خوشکی موسڵمان :**

(ماڵپەڕی بەهەشت ، ماڵپەڕی وەڵامەکان ، کەناڵی بەکورتی)

لە لایەن یەک ستافەوە بەڕێوە دەبرێت ، لە ژێر چاودێری کۆمەڵێک مامۆستای بەڕێز و شارەزای ئەهلی سوننە ، ئەوەی کە بزانین خێر و چاکە و ئێوەی بەڕێز شارەزا دەکات لە حوکمە شەرعییەکان ئێمە ئامادەی دەکەین و بە کورتی و پوختی دەیخەینە بەردەستی ئێوەی بەڕێز .

**تەنها داواکاری ئێمە لە ئێوەی بەڕێز ئەوەیە :** بابەتەکانمان بگەیەنین بە هاوڕێ و کەسانی تر بۆ ئەوەی خەڵکانێکی زیاتر سودمەند بن و ئێوەی بەڕێزیش بەشداربن لە خێرەکەی .

**تێبینی :** هەر بەڕێزێک پێی خۆشە هاوکارمان بێت لە بەرەو پێشچونی کارەکانمان دەتوانێت پەیوەندیمان پێوە بکات لە ڕێگەی ئەم لینکەوە

https://t.me/malpariba8